# چۆن
# تەمەنت درێژ دەکەیتەوە ..؟!

وەرگێڕانی لە عەرەبی یەوە




هەولێر ١٤٢١



والحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على المبعوث رحمة للعالمين سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم، اللهم علمنا ما ينفعنا و نفعنا بما علمتنا وبعد:

بەڕاستی ئامانجی موسڵمان لەم دونیایەدا جیاوازە لەگەڵ خەڵکانیتر، جا ئامانجی موسڵمان لەم ئایەتەی خوای گەورە وەرگیراوە:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ﴾ (الذاريات:٥٦)

واتە:- بەراستی ئادەمیزادو جنۆکەمان دروست نەکردووە تەنها بۆ خواپەرستی نەبێت...، خواپەرستیش لە لایەن موسڵمان ماناو تێگەیشتنێکی گەورەو فرەوانی هەیەو لەم ئایەتە پیرۆزە فەراهەم هاتووە، هەروەك دەفەرموێت:-

﴿ قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ (الانعام :١٦٢)

واتە:- پێیان بڵێ نوێژو خواپەرستی و ژیانو مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە.

بەڵام ئەوەی لێرەدا ڕوبەڕووی موسڵمان دەبێتەوە بریتیە لەم تەمەنە کورتەی کەوا بۆی دیاریکراوە لە لایەن خوای پەروەردگار، هەروەك لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ وەرگیراوە، لە ئەبو هورەیرە-خوا لێی ڕازی بێت- دەگێڕتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

((اعمار امتي ما بين ستين الى سبعين واقلهم من يجوز ذلك)).

واتە:- تەمەنی ئۆممەتی من لە نێوان شێستو حەفتادایەو کەمیان لەمە بەسەردەکەون.

جا گریمان یەکێك شێست ساڵ ژیا، بەڕاستی لە یەك ڕۆژدا (٨)هەشت کاتژمێر دەخەوێت، جا کۆی ئەم کاتژمێرانەی لە تەمەنی دەڕوا و دەخەوێت دەکاتە سێیەکی تەمەنی واتە نزیکەی (٢٠) بیست ساڵ، وە کۆی ئەم کاتژمێرانەی بەڕێی دەکات لە خواردنی خۆراكو جێبەجێکردنی پێویستیە گرنگەکانی دەکات

(٥) پێنج ساڵ گریمان هەموو ڕۆژێك (٢)كاتژمێر لە ژیانی دەڕوات، هەروەها (١٢)دوازە ساڵیش پێش خۆناسین (بالغ) لە ژیانی دەڕوات...

جا کۆی ساڵەکان دەکاتە (٣٧)سی حەفت ساڵ ... لێرەدا موسڵمان گیروگرفتی دەست پێدەکات و هەست بە هەناسەیەکی سارد دەکات بە هۆی ئەم تەمەنە کورتەی لە ژیانیدا بۆی دەمێنێتەوە بۆ وەدەستهێنانی خێروچاکە بۆیە پێویستە مرۆڤی موسڵمان لە هۆیەکانی تەمەن درێژی بکۆڵێتەوەو بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەم کاتانەی لەدەستی دەچێت بە هۆی خەریك بوونی بە ژیانو پێویستیەکانی ژیان، جا لێرەدا دەبێت بەم کردەوانەدا بچینەوە کەوا پاداشتیان چەند جارێکە، هەروەك دەبینین یەکێك (٦٠) شێست ساڵ دەژیت پاشان دەمرێت بەڵام توانیویەتی پاداشتی کردەوەی هەزار ساڵ یان پێنج هەزار ساڵ یاخود چەند جاری ئەم ژمارانە بەدەست بهێنێت ئەمەش بە هۆی چەند ڕێگایەکەوە:-

١- سووربوون لەسەر ئەم كردەوانەی پاداشتی چەندجار بەقەدەر خۆیەتی .

٢- سووربوون لەسەر چەند كارو كردەوەیەكی بەردەوام پاداشتی پاش مردنیشی دەگاتێ.

٣- كات بەفیرۆ نەدان.

ئەمەش چەند ڕوونكردنەوەیەكە لە لایەن موحەممەد كوڕی ئیبراهیمی نەعێمی لە پەڕتووكەكەی بەناوی چۆن تەمەنی خێرت درێژ دەكەیتەوە منیش لێرەدا پێم چاك بوو پەرتووكەكەی كورت بكەمەوە لەم چەند خاڵانەی خوارەوە:-

## سووربوون لەسەر ئەم كردەوانەی پاداشتی چەندجار بەقەدەر خۆیەتی

### ١- ڕۆژوو :-

*پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: ((من صام رمضان ثم أتبعه ستاً من شوال كان كصيام الدهر)). واتە:- هەر كەسێك مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت و پاشان لە

دواييـدا شـەش ڕۆژيـش لـە شـەوال هـەروەك ڕۆژی ساڵێكە.

* پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: ((من صام من كل شهر ثلاثة أيام فذلك صيام الدهر)).

واتـە:- هـەر كەسێك لـە هـەموو مـانگێك سـێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت هەروەك ڕۆژوی ساڵێكە.

جـا خـوای گـەورەش لـە قورئـان بـەم ئايەتـە زيـاتر هانمان دەدات كە دەفەرمووێت:

﴿ مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ﴾ (الانعام: ١٦٠)

واتـە:- هـەر كەسێك چاكەيەك بكـا ئـەوا دەجـاری ئـەم چاكەيەی بۆ دەبێت.

جـا كورتـەی ئەمانـەی باسمـان كـرد پێويستـە پارێزگاری لەم شەش ڕۆژەی شەوال بكەيت بۆ ئەوەی پاداشتی ساڵێكی تـەواوت بۆ تۆمار بكرێت، وە ئەگەر زياتر بەڕۆژوو بوويت واتە سێ ڕۆژ لە هەر مانگێك واتە لـە هـەر سـاڵێك (٣٦) ڕۆژ ئـەوا پاداشـتی سـاڵێكی تريشـت بـۆ تۆمـار دەكرێـت، واتـە (٤٢)ڕۆژ لـە سـاڵێك خێری (٧٢٠) ڕۆژت بۆ تۆمار دەكرێت.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:- (من فطر صائماً كان له مثل اجره غير انه لا ينقص من أجر الصائم شيئاً). واتە:- هەر كەسێك ڕۆژوو بە ڕۆژیەوانێك بشكێنێت، ئەوا چاكەی بە ئەندازەی چاكەی ئەو هەیە، بە بێئەوەی شتێك لە چاكەی ڕۆژیەوان كەم بكاتەوە.

جا ئەگەر لە ماوەی یەك كاتژمێر توانیت ڕۆژوو بە (١٠) ڕۆژیەوان بشكێنیت ئەوا توانیت خێری دە ڕۆژی تەواو بۆ خۆت تۆمار بكەیت (واتە خێری ڕۆژی ١٢٠ كاتژمێر)

## ٢- هەڵسانەوەی شەوی قەدر:

خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ ﴾ (القدر : ٣)

واتە: هەڵسانەوە لەم شەوەدا خێری زیاترە لە (٨٣)ساڵو (٣) مانگ. جا ئەگەر موسڵمان شەوی قەدر هەڵسایەوە بۆ ماوەی بیست ساڵ ئەم شەوانە گرتیەوە، ئەوا بە یارمەتی خوا پاداشتی هەزارو شەش سەدو شێستو شەش ساڵی بۆ دەنووسرێ لە لایەن خوای

گەورە، جا ئەمەش تەمەنێکی درێژیتر نیە لە لاپەڕەی خێرت تۆمار دەکرێت وتەمەن درێژیەکی تر نیە!!

## ٣-کردەوەی چاك لە دەی (ذي الحجة):

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:- ((ما من أيام العمل الصالح فيهن أحب الى الله من هذه الأيام العشر))

واتە:- هیچ رۆژێك نیە کردەوەی چاکی تیا بکەیت، لە لای خوا خۆشەویستر بێت وەکو ئەم دە ڕۆژە... گووتیان:-

ئەی پێغەمبەری خوا هەتا جیهاد لە ڕێگای خواش؟پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:-

((ولا الجهاد في سبيل الله الا رجل خرج بنفسه و ماله ولم يرجع من ذلك بشئ .

واتە:- هەتا جیهادکردنیش لە ڕێگای خوا تەنها پیاوێك نەبێت دەربچێت بە گیانو ماڵی بە هیچ شتێکیان نەگەڕێتەوە.

*وە لەم کردەوە چاکانەی لەم دە ڕۆژە پیرۆزە بریتیە لە دە ڕۆژەکەی ڕۆژانی حەج ئەمەش بریتین:-

أ- جێبەجێکردنی فەڕزی حەج ئەمەش گەورەترین کردەوەکانیەتی، جا یەکێك حەج بکاو کردەوەی خراپ و ناشیرین نەکات خوا پاکی دەکاتەوە لە گوناهەکانی وەکو ئەو ڕۆژەی لە دایکی بووە.

ب- بەڕۆژووبوون بە تایبەتی عەرەفە بۆ غەیری حاجیان هەر کەسێك بەڕۆژوو بێت ئەوا گوناهی دوو ساڵی لەسەر ڕەش دەبێتەوە.

ج- زۆربەی کاتەکان لە تەهلیل و(لااله الله) تەکبیرو (الله اكبر) تەحمید (الحمدلله) بەسەر ببرێت هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:

((مامن أيام أعظم عند الله ولا أحب من العمل فيهن من هذه الأيام العشر فاكثروا فيهن من التهليل والتكبير والتحميد)).

واتە:- هیچ ڕۆژێك نیە گەورەتر بێ و خۆشەویستر بێ لە لای خوا کەوا چاکەی تیا بکەیت، لەم دە ڕۆژە جا تەهلیل و تەکبیرو حەمدی خوای زۆر تیا بکەن.

د- قوربانیکردن.

ه- لەم کارانە دووربکەوە کەوا سوودت پێناگەیەنێت.

## ٤-حەج و عومرە:-

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت: ((تابعوا بين الحج والعمرة فانهما ينفيان الفقر والذنوب كما ينفي الكير خبث الحديد والذهب والفضة)).

واتە:- حەج و عومرە یەك لەدوای یەك بکەن چونکە هەژاری و گوناهـ لادەبات هەروەك چۆن ئاگر خڵت و خاڵی ئاسن و زێڕو زیو لادەبات.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت: ((من حج فلم يرفث ولم يفسق رجع من ذنوبه كيوم ولدته امه)).

واتە:- هەر کەسێك حەج بکات جا تیایدا جوێن نەداو کردەوەی ناشیرین نەکات گوناهەکانی ڕەش دەبێتەوە وەکو ڕۆژی لە دایك بوونی.

ئەگەر خوشك و برای موسڵمان ناتوانێت حەج و عومرە بکەیت ئەوا خۆت بێبەش مەکە لەم کردەوانەی

پاداشتی به قەدەر حەج و عومرەیە، نموونەش بۆ ئەمانە بریتیە:-

أ- ئامادەکردنی چەند کەسێك بە ماڵ بە گوێرەی توانا.

ب- کارکردن بەم فەرموودەیەی ئەنەسی کوڕی مالیك -خوا لێی ڕازی بێت- دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:((من صلى الغداة في جماعة ثم قعد يذكر الله حتى تطلع الشمس ثم صلى ركعتين كانت له كأجر حجة وعمرة تامة تامة تامة)).

واتە:- هەر کەسێك نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ بکات پاشان دابنیشێ و یادی خوا بکات تاکو ڕۆژهەڵدێت پاشان دوو ڕکات نوێژ بکات ئەوا پاداشتی وەکو حەج و عومرەیە بە تەواوی بە تەواوی بە تەواوی.

ج- عەمرەکردن لە مانگی ڕەمەزان جا عبدالله ی کوڕی عەبباس (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت :

( عمرة في رمضان تعدل حجة )

واتــه : عەمریــەك لــە ڕەمــەزان خــێری بەقــــەدەر حەجێکە.

د- ئامــادەبوون لەوانــە زانســتیەکان لــە مزگــەوت پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:

((من غدا الى المسجد لا يريد الا أن يتعلم خيراً أو يعلمه كان له كأجر حاج تاماً حجته)).

واتە:- یەکێك دەربچێت بۆ مزگەوت هیچ نیازێکی نەبێت بێجگە لە فێربوونی چاکە یان فێرکردن، ئەوا پاداشتی وەکو پاداشتی حاجیەکی تەواوە کەوا حەجی کردبێت.

هـ- هاندانی دەورویەرت بۆ بەجێهێنانی نوێژەی فەڕزەکان لە مزگەوت پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:((من خرج من بيته متطهراً الى صلاة مكتوبة فأجره كأجر الحاج المحرم، ومن خرج الى تسبيح الضحى لا ينصبه إلاَ إياه فاجره كأجر المعتمر، وصلاَة إثر صلاة لا لغو بينهما كتاب في عليين)) .

واتە:- هەرکەسێك بە دەستنوێژەوە دەربچێت بۆ نوێژە فەڕزەکان پاداشتی وەکو پاداشتی حاجیەکە

ئیحرامی بەستبێت، وە هەر کەسێك دەربچێت بۆ (ذکرە)کانی بەیانی، هیچ نیازێکی نەبێت تەنها ئەو نەبێت پاداشتی وەکو پاداشتی یەکێکە عومرەی بەستابێ، وە نوێژ لە دوای نوێژ ئەگەر هیچ خراپەیەکی لە نێوان نەبێت دەنووسرێت لە شوێنە بەرزەکان.

و- نوێژکردن لە مزگەوتی (قباء) پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:((من تطهر في بيته ثم أتى مسجد قباء فصلى فيه كان له كأجر عمرة)).

واتە:- هەر کەسێك لەماڵەوە دەستنوێژ بشوات و پاشان چوو بۆ مزگەوتی (قباء) نوێژی تیاکرد پاداشتی عومرەیە.

## ٥-دووپات کردنەوەی چەند سورەتێکی قورئان:-

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: ((قل هو الله أحد ثلث القرآن، وقل يا أيها الكافرون تعدل ربع القرآن...)).

واتە:- ((قل هو الله أحد خێری سێیەکی قورئانە وقل يا أيها الكافرون خێری چارەکێکی قورئانە...)).

جا بـراو خوشـکی موسـڵمان دەتوانیـت لـە کـاتی شانەکردنی پرچت یـان سـواربوونی سـەیارەکەت یـان هەڵسان بە کاروباریماڵەوەت یاخود چاوەڕیٚکردنت بۆ زەنگی تەلـەفۆن و هێنـانی خواردەمـەنی یـاخود چایـە کـەوا دەیـهێنیت بـۆ میـوان یـان کـاتێك مامۆسـتا قوتـابی ڕیز دەکات لە کاتی بەیانی ئەوا دەتوانی چەند خەتمێك لـە قورئـانی پـیرۆز بکـەیت و تۆمـاری بکـەیت لـە لاپەڕەکانێ ڕۆژی دواییت.

## ٦-یادکردنەوەی چەند قات (الذکر المضاعف):

### أ- تەسبیحێك خێری چەند جارە:-

جویـەیری دایکی بڕواداران (خـوا لـێی ڕازی بێـت) دەگێڕتـەوە پێغەمبـەر ﷺ کـاتی بـەیانی لـە لای چـووە دەرەوە کاتێك نوێژی بەیانی کرد، ئەویش هـەر لەسـەر بەرماڵ مایـەوە پاشـان پێغەمبـەر ﷺ لەگـەڵ چێشـتان گەڕایـەوە ئـەویش دانیشـتبوو و پـێی فـەرموو:- ئـەوا هـەر لەسـەر ئـەم شـێوەی لـەم کاتـەی تـۆم تێیـدا جێشهێشتووە؟... ئەویش گووتی:- بەڵێ.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لقد قلت بعدك أربع كلمات ثلاث مرات لو وزنت بما قلت منذ اليوم لوزنتهم...

واتە:- بەڕاستی لە دوای تۆ چوار ووشەم گووت سێ جاران، ئەگەر بیکێشی بەوەی تۆ گووتووتە لەم ڕۆژە ئەوا کێشی دەکات:- ((سبحان الله و بحمده عدد خلقه و رضا نفسه وزنة عرشه ومداد كلماته)).

جا خوشك و برای موسڵمان تەماشای ئەم ڕستە کورتەی پێغەمبەر ﷺ بکە چەند کاتی بۆ کورت کردیتیەوەو خێری چەند زۆرە، کاتێك یەکێك دەڵێت سبحان الله بە ئەندازەی ژمارەو کێشی ئەوە، خوا خێری ئەندازەی ئەوەت بۆ دەنووسی جا گەورەیی خواش فرەوانە، لێرەدا تۆ سەرپشك بەو بڕیار بدە بۆ ئەم تەسبیح کردنە بە ئەندازەی ژمارەی دروست کراوەکانی لەم دونیایەدا لە فریشتەو ئادەمیزادو ئەستێرەو گیانەوەرو باڵندە و ماسی و زیندەوەرو ڕووەك و لم و میکرۆب و هیتر، جا ئەوانە ناتوانرێت مرۆڤ بیانژمێریت، بەڵام خودا بە ژمارەی ئەوانە چاکەت دەداتێ ئەگەر گووتت:-

((سـبحان الله وبحمـده عـدد خلقـه))، جـا دەبێـت ئەندازەی عەرشـی خودا چەند بێت کەوا بە ئەندازەی ئەم کێشە خێرت پێدەگات ئەگەر گووتت:-

((وزنة عرشه)) پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:-

((ما السـماوات السبع من الكرسي الاّ كدراهم سـبعة ألقيت في ترس))... واتە:- گەورەیی حەفت ئاسمانەکان بەرامبەر کورسی هەروەك ئەوەیە حەفت درهەم بخەیتە ناو قەڵغانێك، یان دەفەرمووێت: ((ما الكرسـي مـن العـرش الا كحلقـة مـن حديـد إلقيـت بيـن ظـهري فـلاة (صحراء) من الأرض)).

واتە:- گەورەیی کورسیش بەرامبەر عەرش هەروەك ئەوەیە بازنەیەکی ئاسن بخەیتە نێو سکی بیابانێك لە زەوی.

بەڵام ئەگەر گووتت ((مداد كلمات الله)) خوای گەورە لەم ئایەتە ڕوونی کردۆتەوە:

﴿ قُلْ لَوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَنْ تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا ﴾(الكهف:١٠٩)

واتــه:- ئەگــەر دەریایــەکان هــەموو بکــەیت بــە مەرەکــەبو ووشــەکانی خــوای پێبنوســیتەوە ئــەوا دەریاکـان وشـك دەکـەن پێـش ئـەوەی وشـەکانی خـوا تەواو ببن، ئەگەر چەندەها دەریای تریشمان هێنا.

باوکی ئومامە (خوا لـێی ڕازی بێت) دەگێڕێتـەوەو دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ منی بینی لێوەکانم دەجولاندەوە، فەرمووی چیدەڵێیت ئەی باوکی ئومامە؟ گووتم: یادی خوا دەکەم. فەرمووی :- شتێکت پـێبڵێم خێری زیاتر لەوەی تۆ یادی خوای پێدەکەیت لە شەو ڕۆژدا؟

فەرمووی:- ((الحمدلله عـدد ما خلـق والحمـدلله ملء مـا خلـق والحمـدلله عـدد مـا في السـماوات والأرض، والحمـدلله عـدد مـا أحصـى كتابـه والحمـدلله مـلء مـا أحصى كتابه والحمدلله عدد كل شئ والحمدلله ملء كل شـئ و تسـبيح الله مثلـهن...)) پاشـان فـەرمووی:- ئەوانە فێر ببەو فێری ئەوانی پاشەخۆشت بکە.

## ب : داوای لێخۆشـــبوونێك خێری چەندجارە ((الاستغفار المضاعف)) :-

خوشکو برای موسڵمان ئایا حەز دەکەیت تەنها لە یەك ڕۆژدا بە لای کەمی هەزار ملیۆن خێر کۆبکەیتەوە؟ جا چۆن حەز ناکەیت ئەم ژمارە زۆرە لە یەك ڕستەدا بەدەست بهێنیت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:

((من استغفر للمؤمنين و للمؤمنات كتب الله له بكل مؤمن و مؤمنة حسنة)) ...

واتــە:- هــەر کەســێك داوای لێخۆشــبوونێك بــۆ بڕوادارن بکات خودا بەهەر بڕوادارێکی پیاو و ئافرەت چاکەیەکی بۆ دەنووسێت.

## ٧-جێبەجێکردنی پێویستیەکانی خەڵك:-

عبــدالله ی کــوڕی عومــەر (خــوا لــێی ڕازی بێــت) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((أحب الناس الى الله انفعهم واحب الى الله عز وجل سرور تدخله على مسلم او تكشف عنه كربة او تقضى عنه ديناً او تطرد عنه جوعاً ولأن امشى مع اخي المسلم في حاجة أحب الى من أن اعتكف في المسجد شهراً ومن كف غضبه ستر الله

عورته ومن كظم غيظاً ولو شاء ان يمضيه أمضاه ، ملأ الله قلبه رضا يوم القيامة ومن مشى مع اخيه المسلم في حاجته حتى يثبتها له، أثبت الله قدمه يوم تزول الاقدام وان سوء الخلق ليفسد العمل كما يفسد الخل العسل).

واتـه:- خۆشـەویسترین موسـڵمانان لـه لای خـوا بـه سوودترینیانه و خۆشـەویسترین کردەوەش له لای خوا کەیف خۆشـیەکه بیدەیـت بەسـەر موسـڵمانێك یـاخود ناخۆشـیەکی لەسـەر لاببـەیت یـان قـەرزێکی لەسـەر لاببـەیت یـان برسـیەتیەکی لەسـەر لاببـەیت، وه ئەگـەر بڕوات لەگەڵ برایەکی موسڵمانی بۆ پێویستیەك لە لای مـن خۆشەویسـتره لـه یـەکێك لـه مزگـەوت مـانگێك ئیعتیکـاف بکات، وه هـەر کەسـێکیش لـه تووڕەییەکەی دەسـتی کێشـایەوه خـوای گـەوره عـەیب و عـاری دەشارێتەوه و هەرکەسێك تووڕەییەکی قووت دایـەوه، ئەگەر حەزی کردبا ئەم تووڕەییه لاببات لایدەبرد، خودا له ڕۆژی قیامەت دڵی پڕ دەکات له ڕەزامەندی و ئەگـەر یـەکێك لەگـەڵ بـرا موسـڵمانێکی دەرچـوو بـۆ جێبـەجێکردنی پێویسـتیەك تـاکو بـۆی جێبـەجێ

دەکات، خوا پێیەکانی چەسپاو دەکات ئەم ڕۆژەی پێیەکان ناتوانن خۆیان ڕابگرن و، هەروەها ڕەوشتی خراپ کارەکان تێك دەدات وەکو ئەوەی سرکە هەنگوین تێك دەدات.

## ٨- نوێــــژ :

### أ- بەزۆری نوێژکردن لە هەردوو مزگەوتی حەرەم و مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ :-

ریوایەت کراوە لە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((الصلاة في مسجدي هذا افضل من الف صلاة فيما سواه الا المسجد الحرام أفضل من مئة الف صلاة فيما سواه)) ... واتە:- نوێژێك لەم مزگەوتەی من باشترە لە هەزار نوێژ لە مزگەوتێکی تر، تەنها مزگەوتی حەرام نەبێت، وە نوێژێك لە مزگەوتی حەرام (مەککە) باشترە لە سەد هەزا نوێژ لە مزگەوتێکی تر.

جا یەك نوێژی دە رکاتی لە حەرەمی مەککە، ئەوا خێری یەك ملیۆن ڕکاتی دەبێت.

ب- بەردەوام بوون لەسەر نوێژی (الضحى ):-

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: ((يصبح على كل سُلامي من احدكم صدقة فكل تسبيحة صدقة وكل تحميدة صدقة وكل تهليلة صدقة و كل تكبيرة صدقة والنهى عن المنكر صدقة ويجزى من ذلك ركعتان من الضحى)).

واتە:- بۆ هەر جومگەیەك لە لەشی هەر یەكێكتان چاكەیەك هەیە وە بۆ هەر (سبحان اللە)یەك چاكەیەك هەیە وە بۆ هەر (الحمدللە)یەك چاكەیەك هەیە وە بۆ هەر (لا الە الاّ اللە)یەك چاكەیەك هەیە بۆ هەر (اللە اكبر)ێك چاكەیەك هەیە، بۆ هەر فەرمان بە چاكەو قەدەغە لە خراپەیەك چاكەیەك هەیە، هەروەها ئەم دوو ڕكاتەی لە نوێژی چێشتانە دەكەیت بە قەدەر ئەوانە خێری هەیە.

جا خوشك و برای موسڵمان بە دوو ڕكاتی نوێژی چێشتانە وا بزانە(٣٦٠) چاكەت كردووە لەبەرئەوەی (٣٦٠) جوومگە لە لەشت هەیە.

ج-ماڵو منداڵەکەت هان بدە لەسەرنەوەی بانگدەر چی دەڵێت ئەوانیش بیڵێنەوە:-

پاشان نوێژە سوننەتەکان لە ماڵەوەو نوێژە فەرزەکان لە مزگەوت بکەیت لەگەڵ سونەتەکانی ئادابی نوێژی جومعە، لەبەرئەوەی فەرمان بە چاکە هەروەك کار کەرەکەیە بە چاکە، هەروەها چەند فەرموودەیەك هەیە بەیادیان بهێنەوە، وەکو ئەم فەرموودانە:-

١-پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:-

((ان الله و ملائکته یصلون علی الصف المقدم المؤخر یغفر له مدی صوته و یصدقه من سمعه من رطب ویابس و له أجر من صلی معه)).

واتە:- بەڕاستی خواو فریشتەکان بەزەیی دەڕێژنە سەر ڕیزی پێشەوە لە نوێژ، بانگدەر لە گوناهی پاك دەبێتەوە هەتا دەنگی دەڕوات و ئەو کەسەی لە دوای دەڵێتەوە شاهێدی بۆ دەدات لە وشکایی و تەڕایی و چاکەی ئەو کەسەشی بۆ دەنووسرێت کە لەگەڵی نوێژ دەکات.

٢- عبدالله ی كوڕی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەو پیاوێك گووتی:-

ئەی پێغەمبەری خوا بانگدەرەكان خێریان لە ئێمە زیاترە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:-

((قل كما يقولون واذا انتهيت فسل تعطى)).

واتە:- بڵێ وەكو ئەوەی ئەوان دەیڵێن كاتێك تەواو بوویت داوابكە دەدرێتێ.

٣- پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: ((صلاة الجماعة افضل من صلاة الفذ بسبع وعشرين درجة)).

واتە:- نوێژێكی بە كۆمەڵ باشترە لە نوێژێكی تەنیا بە بیست و حەفت پلە.

واتە پیاو بۆی هەیە ئەم پاداشتە نوێژە فەرزە لە دەست خۆی نەدات لە ماوی ساڵێك پاداشتی بیست و حەفت ساڵ بە دەست بهێنێت بە هۆی جێبەجێكردنی ئەم نوێژە فەرزانە لە مزگەوت.

٤- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:-

((فضل الصلاة الرجل في بيته نافلة على صلاته حيث يراه الناس كفضل الفريضة على التطوع))..

واتە:- خێری نوێژی سونەتێك پیاوێك لە ماڵەكەی بیكات باشترە لەم نوێژەی لە پێش چاوی خەڵك بێت هەروەك گەورەیی فەرزە بەرامبەر سوننەت.

٥- پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:-

(( من غسل يوم الجمعة واغتسل ثم بكر وابتكر ومشى ولم يركب ودنا من الامام فاستمع ولم يلغ كان له بكل خطوة عمل سنة أجر صيامها وقيامها)).

واتە:- هەر كەسێك ڕۆژی جومعە خۆی بشوات و دەستنوێژ هەڵبگرێت پاشان لە پێش خەڵك بچیت بۆ مزگەوتو خواپەرستی بكاتو بە پێ بڕواتو بە سوار نەبێت لە ئیمام نزیك بێتەوە جا گوێی لێبگرێو قسە نەكات ئەوا بە هەر هەنگاوێك كردەوەی ساڵێكی هەڵسانەوەی نوێژو ڕۆژی بۆ دەنووسرێت.

جا ئەگەر دوور نێوان ماڵی ئەم پیاوەو مزگەوت هەزار هەنگاو بێت ئەوا خوای گەورە پاداشتی هەزار ساڵی هەڵسانەوەی نوێژو ڕۆژی بۆ دەنووسێت، واتە لە ماوەی مانگێك كەوا چوار هەفتەیە خێری چوار هەزار

ساڵی دەگاتێ و لەماوەی ساڵێکدا چل‌و هەشت هەزار ساڵ خێری پێدەگات.

٦- پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت :-

((من صلى العشاء في جماعة كان كقيام نصف ليلة و من صلى العشاء والفجر في جماعة كان كقيام ليلة)).

واتە:- هەرکەسێك نوێژی عیشا بە کۆمەڵ بکات هەروەك هەڵسانەوەی نیوەی شەوە، وە هەرکەسێك نوێژی عیشاو بەیانی بە کۆمەڵ بکات، هەروەك هەڵسانەوەی هەموو شەوەکەیە.

## ٩- الجهـــــاد :-

خوای گەورە دەفەرمووێت:-

﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنجِيكُمْ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ (الصف:١٠).

واتە:- ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ئایا بازرگانیەکتان پێ‌ڕابگەیەنم ڕزگارتان بکات لە ئازارێکی توند، بڕوا بهێنن بە خواو پێغەمبەرەکەی و جیهاد

بکەن لە ڕێگەی خوا بە ماڵو گیانتان ئەمە باشترە بۆ ئێوە ئەگەر بزانن.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: ((من رابط يوماً و ليلة في سبيل الله كان له كأجر صيام شهر و قيامه ومن مات مرابطاً جرى له مثل ذلك الأجر و أجرى عليه الرزق وأمن الفتان)).

واتە:- یەکێك پاسەوانی بکات شەو و ڕۆژێك لە پێناوی خوا هەروەك ئەوەیە پاداشتی مانگێكو هەڵسانەوەی بۆ نوێژو بەڕۆژوبونی هەیە و وە هەر کەسێك لە سەنگەری ئیسلام مرد ئەوا بەردەوام ئەم پاداشتەی بۆ دەنووسرێو وە ڕزقی دەدرێتێ و (واتەشەهادەتی بۆ دەنوسرێ) لە سزای گۆڕ ڕزگاری دەبێت.

## ١٠- زۆر صەڵاوات لێدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ:

هەروەك هاتووە هەرکەسێك یەك صەڵەوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ لێبدات خودا دەجار صەڵەواتی لەسەر

لێدەدات و دە گوناهی ڕەش دەبێتەوە و دە پلە بەرز دەبێتەوە.

**درێژکردنەوەی تەمەنی خێر بە کردەوەی بەردەوام (الجاری) کەوا پاداشتەکەی پاش مردنیش دەمێنێتەوە**

## ١-خێرێك پاداشتەکەی بەردەوامە:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:((ان مما یلحق المؤمن من عمله و حسناته بعد موته علماً و نشره و ولداً صالحاً ترکه و مصحفاً ورثه او مسجداً بناه أو بیتاً لإبن السبیل بناه أو نهراً أجراه أو صدقة اخرجها من ماله في صحته و حیاته تلحقه من بعد موته).

واتە:-ئەوەی بڕوادار لە پاش خۆی پێی دەگات لە کردەوەو چاکەکانی پاش مردنی زانستێکە خەڵك فێردەکا و بڵاوی دەکاتەوە، وە منداڵێکی خواناسە لە پاش خۆی جێی دەهێڵێت، وە قورئانێکە لە پاش خۆی جێی دەهێڵێت یان مزگەوتێکە دروستی دەکات یان خانووێکە بۆ ڕێبواران دروستی دەکات یان ڕووبارێکە ئاوی لەبەر بڕوات یان خێرێکە لە ماڵەکەی

خۆی دەریدەهێنێ لە کاتێکدا لەش ساغەو لە ژیاندایە پاش مردنی پێ ی دەگات.

## ٢- خەڵك فێركـــردن :-

پێغەمبـەر ﷺ دەفـــەرمووێت:(( اذا مـــات الانســـان انقطع إلاّ من ثـلاث:- صـدقة جارية وعلم ينتفع بـه و ولـد صـالح يدعـو لـه)... واتـە:- ئەگـــەر مـرۆڤ مـرد کردەوەی دەپچڕێ تەنها لە سێیان نـەبێت :- خێرێکە لەبەری بڕوات وە زانستێك سوودی لـێوەربگیرێت، وە منداڵێکی خواناس دوعای بۆ بکات.

جـا زیندووکردنــەوەی زانســت بــە چــاپ کــردن و بڵاوکردنـەوەی لـە نێـو خـەڵکدا دەبێـت ئەگـەر نـەتتوانی ئەوا هاوکاری ئەو دانـەرە یـاخود مامۆسـتایە بکـە بـە سامان، پاشان بیکە دیاری لە نێو خەڵکدا.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (( من دعـا الــى هـدى كان له من الأجـر مثـل اجور من تبعه لا ينقص ذلك مـن اجورهم شيئاً ومن دعـا الـى ضـلالة كان عليه من الإثـم مثـل آثـام من تبعه لا ينقص من آثامهم شيئاً).

واتـه:- هـەر كەسـێك خـەڵك بـانگ بكـات بـۆ سـەر ئیسلام ئەوا پاداشتی وەكو پاداشتی ئەو كەسەیە كە شـوێنەكەتووی دەبێـت بـەبێ ئـەوەی لـە پاداشـتی شوێنكەوتووەكە كەم بكاتـەوە، وە هـەر كەسـێك خـەڵك بانگ بكات بۆ خراپە واتە ڕێچكە شـەیتانییەكان ئەوا گونـاهی گوناهـ كارەكـەی بـۆ دەنوسـرێت كـە شوێنكەوتووی بووە بە بێئەوەی لە گوناهی ئـەویش كەم بكاتەوە .

جـا خوشـك و بـرای موسـڵمان بـە ڕاسـتی كـاتی بانگكردنی خـەڵك گـەورەترین و بـە پیتـترین كاتـە بـۆ ئەوەی بتوانیت تەمـەنی خێرت درێژكەیتـەوە، چونكـە بانگكردنت بۆ خێر مـەزنترین جۆرەكـانی خـێرە پـاش مردنـت، جـا هـەر زانسـتێك یـاخود بیروڕایـەكی چـاك یاخود نووسـراوێك یـان قسـەیەك خـەڵك سـوودی لـێ ببینێـت، ئـەوا ئـەم خـێرەت لـەپاش مـردن بـۆ دەمێنێتـەوە... بـەڵام ئەگـەر خودانەخواسـتە خـەڵكت بانگ كـرد بـۆ ڕێگایـەك مـەیلی ڕێچكـە شـەیتانیەكانی هەبوو ئەوا پاش مردنی، ئەمانەی بە ڕێگـای ئەویش دا

دەڕۆن گوناهی بۆ دەنێرن و دەفتەری خراپەی داناخرێت.

## ٣-پەروەردەکردنی منداڵی خواناس:-

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:

(( إن الله عزّوجل ليرفع الدرجة للعبد الصالح في الجنّة فيقول: اي ربّ أن لي هذه؟ فيقول باستغفار ولدك لك)).

واتە:- خوای گەورە پلەی بەندەی پیاوچاك بەرزدەکاتەوە لە بەهەشت، جا دەڵێت:- پەروەردگارا ئەوە بۆ منە؟

خوای گەورە دەفەرمووێت: ئەمە بە داوای لێخۆشبوونی منداڵەکەتە بۆ تۆ.

## ٤- هان دانی ماڵ و منداڵت بۆ سەنگەرگرتن لە ڕێگای خوا :

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (( كل ميت يختم له عمله الا الذي مات مرابطاً في سبيل الله فانه ينمي له عمله الى يوم القيامة ويأمن من فتنة القبر)) .... واتە:-

هەموو مردوویێك مۆرلە كردەوەكانی دەدرێت تەنها ئەوە نەبێت سەنگەر دەگرێت لە ڕێگای خودا، بەڕاستی ئەوە كردەوەكـانی گەشـە دەكـات هـەتا ڕۆژی قیامـەت و ڕزگاری دەبێت لە سزای گۆڕ.

سەلمانی فارسی (خـوا لـێی ڕازی بێـت) دەڵێـت:- گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو:

(( رباط يوم في سبيل الله أفضل و ربما قال: خير من صيام شهر و قيامه و من مات فيه وقى فتنة القبر ونمي عمله الى يوم القيامة))...

واتە:- ڕۆژێك سەنگەرگرتن لە پێناوی خوا باشترە یان گوتی خێرترە لە ڕۆژی مانگێك و هەڵسانەوەی، وە هەر كەسێكیش تێیدا مرد ئەوا لە سزای گۆڕ ڕزگاری دەبێ و كردەوەكانی گەشە دەكات تا ڕۆژی قیامەت .

**درێژكردنەوەی تەمەن بە هۆی بەفیڕۆنەدانی كات:-**

ئەگەر ببینیت یەكێك ژمارەیك لە ماڵی خۆی لە چەند هاوڕێیـەكی بـەڕەڵا بـەكاردەهێنێت، لـێرەدا پێویسـت

دەكات ڕێگای لێبگریت و دەست بەسەر ماڵەكەیدا بگریت بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا بەشێك لە تەمەنی دەڕوات، هەرچی ماڵەكەیە دەتوانیت قەرەبووی بكەیتەوە بەڵام ڕۆیشتنی تەمەن گەڕانەوەی بۆ نیە، هەروەك ابن مسعود دەڵێت: (هیچ وەكو ئەوە تێیدا پەشیمان نیمە كاتێك ڕۆژ دەڕوات و بەشێك لە تەمەنم دەڕوات و كردەوەم تیا نەكردووە).

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (( لا تزول قدما عبد يوم القيامة حتى يسأل عن اربع خصال: عن عمره فيما افناه و عن شبابه فيما ابلاه وعن ماله من أين أكتسبه وفيما انفقه و عن علمه ماذا عمل فيه)).

واتە:- بەندە ڕۆژی قیامەت لە شوێنی خۆی ناجوڵێت تاكو پرسیاری چوار شتی لێنەكرێت:- ئەم تەمەنەی لەچی بەڕێكردووەو ئەم گەنجاتیەی لەچی سەرف كردووەو ئەو ماڵەی چۆن پەیداكردووەو چۆنی بەخشیوەو وە ئەو زانستەی لەچی بەكارهێناوە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (( ما جلس قوم مجلساً فلم يذكروا الله فيه إلا كان عليه ترّة (أي نقص او حرّة)

وما من رجل مشى طريقاً فلم يذكر الله عزّوجل الاّ كان عليه ترّة وما من رجل أوى الى فراشه فلم يذكر الله الاّ كان عليه ترّة)).

واته :- هەر کۆمەڵێك لە مەجلسێك دانیشتن ناوی خوایان تیا نەهێنا ئەوا کەموکورتیەکیان هەیە، وە هەر پیاوێکیش بە ڕێگایەك دا ڕۆیشت و ناوی خوای گەورەی تیا نەهێنا ئەوا کەموکورتیەکی هەیە، وە هەر پیاوێك چووە سەرجێگا و ناوی خوای تیا نەهێنا ئەویش کەموکورتیەکی هەیە.

## ڕێگاکانی کات بەفیڕۆنەدان :-

* گوێدانی کاسێتی بەسوود لەناو ئۆتۆمۆبیل یان لە کاتی ڕاپەڕاندنی کاروباری ناوماڵ.

* ئەگەر لە ماوەی ساڵێکدا گوێت دا (٢٠٠) کاسێت کەواتە تۆ لەم ماوەدا (٢٠٠) کاتژمێرت لە تەمەنت هەڵقۆستەوە کەوا خوای گەورە تیایدا لێت ڕازی بوو، هەروەك باپیرەی ئیمام ابن تیمیة ئەگەر بیویستبا بڕوات

بۆ ئاودەست داوای دەکرد یەکێك لە کتابە زانستیەکانی بە دەنگێکی بەرز بۆ بخوێننەوە.

* دانانی چەند ئامانجێکی ڕوونو دیاریکراو لە ژیانو ئامادەکردنو هەڵقۆستنەوەی هەموو کاتەکان بۆ بەدیهێنانی.

* سووربوون لەسەر هەڵسان بە کردەوەیەك کەوا پاداشتی چەند قاتەو وە ئەو کردەوانەی کەوا پاداشتی لەپاش مردنیش دەمێنێ.

* موسڵمان ئەگەر نیازی لە خواردنو خواردنەوەو نووستن بەهێزکردنی لەشی بوو بۆ خواپەرستی ئەوا پاداشتی دەدرێتەوە لەسەر ئەم نیازە پاکە.

خوشكو برای موسڵمان:- ئەگەر خوای گەورە هیدایەتی دایت بۆ هەڵسان بەم کردەوە چاکانە، جا ئاگاداری بەو ئاگاداری ئەم کردەوانەبە:-

**١- بەتاڵ بوونەوەی چاکەکان:-**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (( لأعلمن أقواماً من أمتي يأتون يوم القيامة بحسنات أمثال جبال تهامة

بيضاء فيجعلها الله عزّوجل هباءً منثوراً)). واته:- چەند كۆمەڵێك لە ئۆمەتی من ڕۆژی قیامەت بە چەند كردەوەیەك دێن نموونەی چیای توهامە سپی، جا خوای گەورە كردەوەكان دەكاتە تەپ‌وتۆز و بە ئاسمان بڵاوەی پێدەكات... ثەوبان (خوا لێی رازی بێت) گووتی:-

ئەی پێغەمبەری خوا وەسفی ئەمانەمان بۆ بكە تاكو لەوانە نەبین و ئێمە نازانین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

(( أما إنهم اخوانكم و من جلدتكم و يأخذون من الليل كما تأخذون ولكنهم أقواماً إذا خلوا بمحارم الله انتهكوا)).

واتە:- بەڵام ئەوانە برای ئێوەن و لە نەوەی ئێوەن، بەشێكیان لەشەو هەیە هەروەكو ئێوە هەتانە، بەڵام ئەمانە كۆمەڵێكن كاتێك دێنە ناو سنوورەكانی خوا دەیبەزێنن.

٢-دەستدرێژی كردنە سەر مافەكانی خەڵك:-

لە ئەبوهورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) بە صەحیحی هاتووە لە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(( أتدرون ما المفلس؟))

واته:- (ئایا دەزانن بارك بەتاڵ كێیە؟ گووتیان :- بارك بەتاڵ لە لای ئێمە ئەو كەسەیە نە درهەمێك و نە كەلوپەلێكی هەبێت. جا فەرمووی:

(( ان المفلس من امتي يأتي يوم القيامة بصلاة وصيام و زكاة و يأتي وقد شتم هذا و قذف هذا وأكل مال هذا و سفك دم هذا و ضرب هذا فيعطي هذا من حسناته فان فنيت حسناته قبل ان يقضى ما عليه أخذ من خطاياهم فطرحت عليه ثم طرح في النّار)).

واته:- بارك بەتاڵ لە ئۆمەتی من ڕۆژی قیامەت بە نوێژو ڕۆژیو زەكات دەیهێنن، دێت جوێنی بە ئەو دایەو تانەو تەشەری لە ئەو دایەو ماڵی ئەوی خواردیەو خوێنی ئەوی ڕشتووەو لە ئەمی داوە، جا لە چاكەی ئەو پێیان دەدرێتەوە كاتێك چاكەكانی تەواو بوون پێش ئەوەی قەرزی خەڵك بداتەوەو چاكەكانی نەما، لە گوناهەكانی ئەوان هەڵدەگیرێو دەخرێتە سەریو پاشان لەگەڵ كردەوەكانی فڕێ دەدرێتە ناو ئاگر.

**٣-ئەو خراپانەی بەردەوامن لە پاش مردن:**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (... من سن في الاسلام سنة سيئة فعليه وزرها ووزر من عمل بها من غير ان ينقص من اوزارهم شيئاً)).

هەر یەکێك ڕێگایەکی خراپ لە ئیسلام دابهێنێت، جا ئەم گوناهەی لەسەرە لەگەڵ گوناهی ئەو کەسەی کاری پێدەکات بەبێ ئەوەی لە گوناهی ئەوان شتێك کەم ببێتەوە.

شاطبی دەڵێت:- خۆشی بۆ ئەو کەسەی دەمرێت و گوناهەکانیشی لەگەڵی دەمرن، وە ئازارو ئەشکەنجە بۆ ئەو کەسەی دەمرێت و گوناهەکانیشی دەمێنێتەوە بۆ ماوی سەد ساڵ دوو سەد ساڵ ئەویش لە گۆڕ ئازاری پێدەخوات تاکو گوناهەکانی لەسەر دونیا نامێنێت؛ بۆ نموونە هەندێك باوك سەتەلایت بۆ منداڵەکانی دەکڕێت، پاشان بە خۆشی بەسەردا دەمرێت، نەوەکانیشی دەکەونە ناو ئەم گوناهەو گوناه بۆ باوکیان بەرێدەکەن، یاخود دەبینین یەکێك هاوڕێیەکی خۆی بۆ سەر ڕێچکۆڵەیەکی گومڕایی دەبات، ئەم پیاوە

پاش ئەوەی دەمرێت وەکو جیهازیئەنتەرنێت گوناهی بۆ ڕەوانە دەکات.

**٤- خۆ بە گەورە زانین و لە خۆبایی بوون بە کردەوەی چاك:-**

ئەوەی جێگای ترسە لەسەر موسڵمان ئەوەیە تووشی نەخۆشی خۆ بە گەورە زانین بێت لە کاتێکدا بە چاوێکی گچکە تەماشای گوناهی گچکە بکات ئەگەر بەراوردی بکات بە تۆمارکردنی کردەوە چاکە زۆرەکانی، جا شەیتان فێڵی لێدەکات بەوەی ئەم گوناهەی گچکانە لەناو دەریای کردەوە چاکە زۆرەکان بزر دەبێت، پاشان شەیتان دەست دەکات بەوەی قەناعەتی پێ بێنێت بەوەی گوناهی گچکە ئەوەندە گرنگ نیە بەرامبەر لێبوردەیی خواو ئەم کردوە چاکە زۆرانەی تۆماری کردووە، جا دەست دەکات بەوەی ئەم کردەوە چاکە گەورانە بێنێتەوە پێش چاوی تاوای لێدێت بکەوێتە ناو ئەم نەخۆشیە خۆ بەگەورە زانین و لەخۆبایی بوونە، هەروەك عبداللە ی کوڕی مەسعود (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت:- (ڕزگاربوون لە دووشتە لەخواترسان و نیازە، بە هیلاك چوونیش لە دووشتە نائومێدی و خۆ بەگەورە زانینە).

## ڕێگاکانی چارەسەرکردنی لەخۆبایی بوون بە زۆری کردەوەی چاك:

١- دەبێت ئەوە بزانیت بەندە هەیە لەتۆ زیاتر کردەوەی چاك بە دەست دەهێنێت وەکو ئارامگرەکان ئەوانەی ئارام دەگرن لەسەر بەلا، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت:-

﴿ إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ (الزمر:١٠)

٢- دەبێت بزانیت هەرچەندە کردەوەی چاك بکەیت، ئەوا ڕۆژی دوایی ئەم کردەوە بەگچکە دەزانیت هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:

(( لو ان رجلاً يجر على وجهه من يوم ولد الى يوم يموت هرماً في مرضاة الله تعالى لحقره يوم القيامة)).

واتە:- (ئەگەر پیاوێك لەسەر ڕوو ڕایبکێشن لەم ڕۆژەی لەدایك بووە تاکو ئەو ڕۆژەی بە پیری دەمرێت بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە ئەوا ڕۆژی قیامەت ئەم کردەوانەی خۆی بە سووك تەماشا دەکات).

٣-دەبێت بزانێت ئەم کردەوانەی بەدەستی دەهێنێت بەهۆی هیدایەتی خواو گەورەیی خوایە هەروەك دەفەرمووێت :-

﴿ وَمَا بِكُمْ مِنْ نِعْمَةٍ فَمِنْ اللَّـهِ ... ﴾ (النحل: ٥٣)

٤-پێویستە متمانەت نەبێت بە زۆری کردەوەکانت چونکە نازانیت ئەم کردەوانەت لێوەرگیرایە یاخود نا!!

... عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت:-

پرسیاری ئەم ئایەتەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد :

﴿ وَالَّـذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَقُلُوبُهُمْ وَجِلَـةٌ ...﴾ (المؤمنون: ٦٠)

عائیشە گووتی:- ئایا ئەوانە ئەو کەسانەن عەرەق دەخۆن و دزی دەکەن؟ فەرمووی: ((لا یا بنت الصدیق ولکنهم الذین یصومون و یصلون ویتصدقون وهم یخافون أن لایقبل منهم أولئك الذین یسارعون في الخیرات))..

واتە:- نەخێر ئەی کچی صدیق بەڵکو ئەوانەن بەڕۆژوو دەبن و نوێژ دەکەن لەوەش دەترسن ئەم چاکانەیان لێ وەرنەگرێت ئەوانە کەوا پێشبڕکێ دەکەن لەسەر چاکە.

# کردەوەی بڕواداری ڕاستەقینە لە شەو و ڕۆژێکدا

١- یادکردنەوەی خـوای گـەورە لـە کـاتی هەڵسـان لـە خەودا.

٢- سووربوون لەسەر نوێژی بەیانی لە مزگەوت .

٣- لە دوعای ڕۆژانەدا یەکەم جار دوعا لە خوا بکات ڕزقێکی حەڵاڵی پێ ببەخشێت.

٤- پەنا ببات بە خودا لە سزای دۆزەخ.

٥- داوا لە خوا بکات بیبات بۆ بەهەشت.

٦- پارێزگاری لە پێنج نوێژەکە بکات لە مزگەوت لـە کاتی خۆیدا.

٧- جێبەجێکردنی سوننەتەکان.

٨- نوێژەکان بە ملکەچی و خشوع بکرێت.

٩- لـە خـوا بترسێت لـە نـان پـەیداکردن و خـواردن و خواردنەوەو جل وبەرگ.

١٠- سـوپاس و حـەمدی خـوا بکـات لەسـەر نیعمـەتی ئیسلام.

١١- هەڵقۆستنەوەی کاتەکانی دوعا قبوڵ بوون بۆ لە خوا پاڕانەوە.

١٢- کار بکات بەوەی دەیخوێنێتەوەو لەبەری دەکات لە قورئانی پیرۆز.

١٣- فەرمان بە چاکە بکاو قەدەغەی خراپە بکات.

١٤- بچێت بە دوای تەرمی برا موسڵمانەکەی و سەرەخۆشی مردووی لێبکات.

١٥- ئامۆژگاری براکەی بکات بۆ خودا.

١٦- بەوەفا بێت بۆ پەیمان و ڕاستگۆ بێت بۆ بەڵێن.

١٧- سەردانی ئەو کەسە بکات کە سەردانی ناکات.

١٨- دادوەربێت لە کاتی تووڕەیی و ئارامی (واتە کار بە دادوەری بکات).

١٩- لەو کەسە ببورێت کەوا ستەمی لێدەکا، بدات بەو کەسەی لێی قەدەغە کردووە.

٢٠- بێدەنگی بیرکردنەوە بێت و قسەکردنی یادکردنەوە بێت و تەماشاکردنی پەند وەرگرتن بێت.

٢١- بەردەوام ترسی خوای هەبێ و گریانی لە قوڕگی بێت.

٢٢- زۆر (استغفر الله) بكات بۆ ئەوەی خوا لە گوناهی خۆش بێت.

٢٣- داوا لە خودا بكات دڵی بچەسپێنی لەسەر ئیمان.

٢٤- داوای لێخۆشبوون بۆ براو خوشكە بڕوادارەكانی بكات.

٢٥- ببەخشێت بەسەر هەژارو پێویستان.

٢٦- هەموو كات زەردەخەنە بباتەوە بە برا موسڵمانەكەی لەبەرئەوەی چاكەی تیایە.

٢٧- بۆخۆی تووڕە نەبێت بەڵكو بۆ خوای گەورە تووڕە ببێت ئەگەر سنووری خوایان بەزاند .

٢٨- دڵی پاك ببێتەوە لە نەخۆشیە دەروونیەكان وەكو ڕق و كینەو حەسادەت و هیتر...

٢٩- ئەگەر تووشی بەڵایەك هات بڵێت :-

﴿ انّا لله وانآ اليه راجعون ﴾.

٣٠- حەمدوستایشی خوا بكات لەسەر گوێ و چاو و دڵ و هەموو نیعمەتێك كە خوا پێیبەخشیووە.

٣١- كاركردن بەوەی دەیخوێنێتەوەو لەبەری كردووە لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ .

٣٢- به هەموو ئەندامەکانی له چاوو گوێو داوێن له شتی حەرام دووربکەوێتەوه.

٣٣- زۆر صەلەوات لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ لێبدات.

٣٤- سەردانی نەخۆشان بکاو له ئەحواڵیان پرسیار بکاو دڵیان بداتەوه.

٣٥- یارمەتی بدات به براکەی بۆ خوداو هەروەها دەرگای پێویستی لێقەوماوان دابخات.

٣٦- له کارەکانی دڵسۆز بێت به نهێنیو ئاشکرا وا بزانێت خوای گەورە لەسەری چاودێره.

٣٧- مام ناوەندی بێت له نێوان هەژارییو دەوڵەمەندی واته نه دەست بڵاو بێتو نه قرچۆك.

٣٨- ئەگەر یەکێکی خۆشویست بۆ خوا خۆشی بوێتو ئەگەر ڕقی له یەکێك بۆوه بۆ خوا ڕقی لێببێتەوه.

٣٩- دیاری لەگەڵ برا موسڵمانەکانی بگۆڕێتەوه بۆ ئەوەی دڵیان بۆ لای خۆی ڕابکێشێتو خۆشەویستی زیاتر ببێتو پەیوەندی بەهێزتر بێت.

٤٠- برادەری چاك هەڵبژێری و دووربكەویتەوە لە برادەری خراپ.

٤١- دوور بكەویتەوە لە پێكەنینی زۆر لەبەرئەوەی پێكەنینی زۆر دڵ دەمرێنێ.

٤٢- دەروونی خۆی ڕابهێنێت لە سیفەتە بەرزەكان وەكو نەرمونیانی و ئارامو لەخواترسی و مل كەچی بۆ خواو بەزەیی و پشت بەستن بە خواو دڵسۆزی.

٤٣- ئەم دوعایە زۆر بكات: ﴿ اللهم إني أعوذ أن أشرك بك وأنا أعلم واستغفرك لما لا نعلم ﴾ هەركەسێك ئەم دوعایە بكات خوا لە هاوبەش پەیداكردنی نهێنی و ئاشكرا دەیپارێزێت.

٤٤- هەموو كات مردن و گۆڕو ڕۆژی قیامەتی لەیاد بێت.

٤٥- بۆ خوا بەڕۆژوو بێت ئەوەندەی لە توانایدا هەیە لە دوو ڕۆژی دووشەمەو پێنج شەممە یاخود سێ ڕۆژ لە مانگێك (الایام البیض) (١٣-١٤-١٥).

٤٦- ئەم دوعایانە لە یاد نەكات بە تایبەتی دوعای هاتنە ماڵەوەو دەرچوون و چوونە ناو مزگەوت و

ئاودەستو لەبەرکردنی جلوبەرگو خواردنو خواردنەوە .

٤٧- ئەم مافانە جێبەجێ بکات چ لەسەرەخۆی بێ یان لەسەر ماڵو سامانیی لە:- مافی دایكو باوكو خێزانو منداڵەکانیو نزیکەکانیو مافی بانگهێشتن بۆ خوای گەورە .

٤٨- ئەم کاروبارانەی شەو ڕۆژی جومعە جێبەجێ بکات لە خۆشوشتنو بۆن لەخۆدانو لەبەرکردنی جلوبەرگی و هەڵقۆستنەوەی کاتەکانی دوعاو خوێندنەوەی سورەتی (کهف)و صەلەوات لێدان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ .

٤٩- سوور بێت لەسەر فێربوونی واجباتەکانی ئایینو ئامادەبوون لە کۆبوونەوە زانستیەکان.

٥٠- کۆتایی ڕۆژی بهێنێت بە تۆبەی ڕاستەقینە و پاشگەزبوونەوەو مل کەچی.

له کۆتاییدا له خوا دەپاڕێمەوه موەفەقمان بکات بۆ ئەم کردەوانەی بە تەنها بۆ ڕەزامەندی ئەوەو دوورمان بخاتەوه له ڕیایی و له خۆبایی، وا بکات ئەم کردەوه چاکانەمان لەپاش مردنیش بە کەڵکمان بێ و برا موسڵمانەکانمان لە هەموو جیهان بە تایبەتی لە شیشان سەرکەوتوو بکاو دوژمنی گەورەی موسڵمانان جولەکەی نەفرەت لێکراو و ڕوسیای ڕووڕەش ڕیسواو ناشیرن بکات لە دونیاو قیامەت... هەروەها خودا پاداشتی خێری برای موسڵمان (عبدالرؤف) بداتەوه کەوا نوسخەی ئەم نامیلکەی پێگەیاندم.

(وآخر دعونا أن الحمدلله رّب العالمين.

٩ / ربيع الاول /١٤٢١

١١ / حزيران / ٢٠٠٠

تێبینی/ ئەم ئامۆژگارییانە لە ئامۆژگاریەکانی مامۆستا شێخ عبدالرحمن عبدالکریم بەرزنجی وەرگیراوه لە نامەیەك بۆ برادەرێکی موسڵمانی.

# دعـــــاء

اللهم يا مقلب القلوب والابصار ثبت قلوبنا على دينك، اللهم ارزقنا حبـك واجعل حبك أحـب الـينا من نفسـنا و أهلـنا ومالـنا .. ..

اللهم اعذنا من الفتن ما ظهـر منها وما بطـن ...

اللهم ارزقنـا قـلبـاً خاشـعاً لك يحبـك و يجلك و يخافك و يعظـمك ...

ربنا آتنا من لدنك رحمـة وهيأ لنـا من أمرنا رشـدا.

اللهم أمنحنا شـجاعة المجاهدين الصادقين .. أللهم أمنحنا ثبات المؤمنين الاقوياء ..

اللهم إجعـل عملـنا كله صـالحاً لوجهـك العظيم ولا تجعـل لأحـد منه شـيئا.

اللهم أعذنا من القسـوة والغفـلة والذلـة والمسـكنة ولا تحرّمنـا يا رب خيـر ما عندك بسـوء ما عـندنا .